رسول الله ﷺ دەفەرموێت:

((إن الاسلام بدأ غريبا وسيعود غريبا، فطوبى للغرباء))

واتا: إسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە بە نامۆیی دەگەڕێتەوە.

[ رواه مسلم]

بسم اللّه، والحمد للّه، والصلاة والسلام على رسول اللّه وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه. أما بعد:

ئێمەی موســـڵمـان لە بـاوەڕەکەمـان بەنرخترمـان نیە بۆیە دەبێـت هەموو هەوڵێکمـان تـاوەکو مردن بۆ پـاراســـتن و زیـاد کردن و پتەوکردنی ئەو باوەڕە بێت، وە بۆ لابردنی ئەو کۆســـپ و ڕێگرانە بێت کە ڕێگە لە پتەوبوونی باوەڕەکەمان دەگرن.

موسـڵمان دەبێت هەمیشـە مەترسـی لەوە هەبێت کە ڕۆژێك دابێت باوەڕەکەی لەدەسـت بدات بەتایبەتیش لەم سـەردەمەدا کە شـەڕ و ئاشوب و بەرەڵلایی تێیدا بڵاوە،

بەڕاستی ئەگەر کەسێك مەترسی لەدەستدانی باوەڕی نەبێت ئەوە کەســـێکی نەزانە، و لە مەترســـیەکی گەورەدایە.... لێرەوە دوو نمونەتان بۆ باس دەکەم دەربارەی ترســـی لەدەســـتدانی باوەڕ لای پێغەمبەران:

پێغەمبەری اللّه -صـــل اللّه علیه و ســـلم- زۆر جار ئەم دوعـایەی دەکرد: "يَـاْ مُقَلِّـبَ الْقُلُوْبِ ثَبِّـتْ قَلْبِي عَلَى دِيْنِـكَ" واتە: ئەی هەڵگێڕەوەی دڵەکان دڵم جێگیر و چەسپاو بکە لەسەر ئاینەکەت.
کە پێغەمبەری اللّه -صـل اللّه علیه و سـلم- لە خۆی ترسـا بێت بەو بـاوەڕە تۆکمەیەوە کە هەیبووە ئەی من و تۆی بـاوەڕ لاواز چین کە نەترسین و بێخەم بین!

پێغەمبەر ئیبراهیم -علیه السـلام- لە یەکێك لە دوعاکانیدا -کە اللّه تعالى لە قورئاندا باسـى کردووە- فەرمویەتـی: ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ﴾ [إبراهيم ٣٥]، واتە: وە پەروەردگارم خۆم و نەوەکانم بەدوور بگرە لە پەرستنی بتەکان.

سـبحان اللّه! پێغەمبەر ئیبراهیم -عَلَيْهِ السَّـلَامُ- کە پێشـەوای موەحیدان و شـکێنەری بتەکان بووە و وازی لە باوك و گەلەکەی هێناوە لەبەر ئەوەی بتپەرست بوون، هێشتا دەترسێت لەوەی ڕۆژێك دابێت خۆی و نەوەکانی تووشی بتپەرستی ببن.

دەبێ موسڵمان لەم سەردەمە زیرەک بی و فرێوی زۆری ئەو کەسانە نەخوا کە خۆیان بە موسڵمان و (ئەهلی سوننە) ناو دەبەن! بەراستی بە درێژایی مێژوو لە سـەردەمی صـەحابە بە دواوە چەندین گروپی جۆراوجۆر پەیدا بوون، کە هەموویان ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە (ئەهلی سـوننەن)، بەڵام لە راسـتیدا ئەهلی بیدعەن، بەلام هەموویان بەشێکیان لە ئەهلی سوننەیان تەتبیق دەکرد بۆ ئەوەی خەڵکی فریو بدرێن تا بیدعەکانی تریان بە سوننە لە قەلەم بدرێت! لەم سـەردەمە دا گەر هەر یەکێک تان پسـیار لە خەڵکی بکا کە سـوننی کێیە؟ زۆربەیان دەلێن: هەرکەسـێک کە شـیعە نەبێ، یان هەرکەسێک کە صەحابەکانی خۆش بوێ.

بەڵام لە راستیدا (ئەهلی سوننە) تەنها ئەو کەسەیە کە لە بیروباوەر و قەول و کردار بە تەواوی لەسەر مەنهەج و ئیجماعی سەلەف بێ.

سەلەف وایان وتووە کە هەرکەسێک دژی یەکێک لە أصول (بنەمای) ئەهلی سوننە بیتن ئەو کەسە موبتەدیعە، هەرچەند لە بابەتەکانی تر موافقی ئەهلی سوننە بێ.

بەڵام بەداخەوە دوای وەفاتی زانایان، ئەو کەســـانەی کە خۆیان بە ئەهلی علم دەزانن ئەو قاعیدەیان تەرک کرد تاکو دەرگای تەبدیع دابخرێت بەسەر خۆیان و زاناکانیان کە توشی بیدعە بوون!

ئیمام بەربەهاری دەفەرمێ: (بە کەسـێک ناوترێ ئەهلی سـوننە تاکو تەواوی بنەماکانی سوننە لەودا مەوجود بن). [شرح السنة].

وە ئیمام احمد و زۆرێک لە زانایانی تر کە باســـی بنەما و بیروباوەری ئەهلی ســـوننە و جەماعەت دەکەن دواتر دەفەرمون: هەرکەســـێک دژی یەکێک لەو بنەمایانە بێت، یان طەعن بدا لە خاوەنەکانیان، ئەوا ئەو کەسە موبتەدیعە. [أصول السنة] - [سير أعلام النبلاء].

بـەو بـاســـە غوربـەتـی ئـەهلی ســـوننـەت بۆ دەردەکـەوێ، وە ئـەو غوربەت و نامۆییە هی سـەردەمی ئێســتا نیە، بەڵکو لە سـەردەمی پێشین دا وا بووە، گرۆپ و فیرقەی زۆر دەهاتن و خۆیان بە موسلمان و ئەهلی سـوننە ناو دەبرێت کەچی لە راسـتیدا ئەهلی بیدعە بوون،

هەروەکو (خەواریج، قەدەری، جەهمی، موعتەزیلە، مورجیئە، ئەشاعیرە، هتد...).

بۆیە ئەی خوشک و برای ئەهلی سوننە بە کەمی ژمارەی ئەم ڕێبازە خەفەت مەخۆ و بێ هیوا مەبە، چونکە هەموو کات ئەوانەی بانگەواز کاری ڕێگای حەقن ژمارەیان زۆر کەمترە لە ئەوانەی ڕێگای باطل.

هەتا پێوەرێت بۆ بابەتەکان (قورئان و سوننەت) بێت هەرگیز ڕێت لێ وون نابێت، زۆر هەلە دەکەیت گەر پێت وابێت کەسێکی دیاریکراو یان مامۆستاییێک کە تۆ پێی سەرسامیت سەرچاوەی ڕاستییەکانە لە ئیسلام دا، قورئان و سوننەت هەمیشە وەک خۆیان دەمێننەوە، ئەگەر هەرکەسێک بێت پێچەوانەی قورئان و سوننەت بکات نابێت لێی وەرگریت، نەبیتە کۆیلەی فیکر و بیری هیچ کەسێک و جەماعەتێک بە نازناوەکان (سەلەفی و موەحید و غورەباء...هتد..) هەڵمەخەلەتێن، ئیسلام لە (قورئان و سوننەت) بە تێگەیشتنی سەلەف وەرگرە، ئەگەر دوای فلانە مەلا و جەماعەتە کەوتی کاتێک کەسێک حەقت بۆ ڕوون دەکاتەوە، عارەق لە نێوچاوانتا ئەتکێ ناتوانیت پێی بلێت ڕاستە ئەوە حەقە من هەڵەبووم، بۆ ناتوانی؟ چونکە تووشی تەعەصوبێک بویت تەنها اللّه ئەیزانێ، تۆ وازت لە سەرچاوە پاکەکە هێناوە کە (قورئان و سوننەتە) بە تێگەیشتنی سەلەف، ڕویشتوویت دەستت بە کڵاوی فلان و فلان گرتووە.

لەســەر ئینســانە کەوا حەق بناسـێت بە بەڵگە، چونکە ئەگەر حەق بناســێت بە بەڵگە شــەرعیەکان، ئەوا کردەوەکانی خەڵکی پێوانە دەکات بەو حەقە، هەر کامەیان لەسەر حەق بوو دەیناسێت و وەری دەگرێـت، هەر کـامەشــیـان پێچەوانەی حەقەکە بوو ئەوا ڕەتی دەکاتەوەو پێی هەڵناخەڵەتێت هەرچەندە ڕاجیاشی زۆربێت، ئینسان کاتێک حەقی بۆ ڕوون بۆوە، دڵ تەنگ نابێت بەکەمی قەبوڵکارانی، وە زۆری ســەرپێچیکاران، بەتایبەت لەکۆتایی ئەم زەمانە هەرکەس ووتی موسـڵمانم عقیدەی بە قورئان و سـوننەت بەراورد بکە ئەگەر وابوو الحمدلله گەر وا نەبوو تەبەڕای لێ بکە گەر نوری چاوەکانیشتە. بۆیـە ئـەی برا و خوشــکی موســلـمان یـەقینت هـەبێت لـەســـەر تەوحیدەکەت وە گومانت نەبێت لەســـەر بەتاڵی ئەوانەی شـــوێن غەیری ڕێبازی ئیســـلام کەوتوون، تاکە ڕێگا بتگەینێتە بەهەشـــت ڕێگای قورئان و ســـوننەتە بە فەهمی ســـەلەف گەرچی ڕێگاکە هەڵگرانی زۆر کەمن.

ئیمامی أحمد دەفەرموێت: (ڕەحمەتی الله تعالی لەو بەندەیەی بیر دەکـاتەوە و دەگەڕێتەوە لەو قســـەیەی کە پێچەوانەی قورئـان و ســـونەتە، وە هیچ شـــتێـك نـاڵێـت لەســـەر الله تعـالی ئیلا حەق نەبێت).[الرد علی الزنادقة والجهمیة].

گرنگ نیە چەندە لەسەر گومڕای و باطل بویت، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کاتێك حەق و مەنهەجی ســـەلەفت بۆ ڕونکرایەوە و پیچەوانەی ئەو عەقیـدەی تۆ بوو کە چەنـد ســـاڵە لەســـەریـت، بگەڕێیتەوە لەو

عەقیدەیەت و بچیتە سەر مەنهەجی حەق، عیزەتی نەفسی خراپەکار و لۆمەی لۆمەکاران کاریگەری نەبێت لەسەرت کاتیك حەقت بۆ ڕون بویەوە.

بۆیە گەر ڕۆژێک هیچ کەسێک پشتگیری ئەو عقیدەیەی نەکرد کە تۆ هەتە، یاخود بەردەوام دەوروبەرت چۆڵ بوو، تەنانەت کەسە نزیکەکانیشت بە بێگانە سەیریان کردی، هیچ بە گومان مەبە، مادام لەسەر عقیدەی اهلی السنة و الجماعةی، ئایە دەکرێت بچیتە گوندێک کە خەڵکەکە گشتیان ناتەواون تۆش بڵێیت دەی با خۆم وەکو ئەوان لێبکەم بۆ لە ئەوان جیاوازبم؟؟؟!!! بۆیە نیگەران مەبە بە کەمی ڕێبواران، هەلمە خەلەتێ بە ژمارەی زوری تیاچوان،

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: کەسی دەستگرتوو بەدینەکەیەوە لەکاتی خراپبوونی خەڵکدا وەک کەسێکە دەستیگرتبێت بە خەڵوزەوە.
[الإبانة الصغرى لإبن بطة ٣٦]

دەفەرموێت ﷺ: ئەو کەسەی دەستی بە دینەکەیەوە گرتووە لە هەرەجا [ڕۆژانی کوشت و کوشتار] وەك ئەو کەسە وایە کە هیجرەتی کردووە بۆلای من.
[الإبانة الصغرى لإبن بطة ٣٧]

یوسف کوڕی أسباط دەڵێت: ئەهلی سونە زۆر زۆر کەمترن لە گۆگردی سوور. (ذم الكلام ٤٧٤)

گۆگردی ســـوور جۆرە گۆگردێکە کە زۆر کەم ودەگمەنە و زۆر پڕ بەهایە بۆیە سەلەف لە سەردەمی خۆیاندا نمونەی ئەهلی سونەیان بەم نەوعە گۆگردە هێنـاوەتەوە، ئەی ئەبێ بۆ ئەم ســـەردەمە چ نمونەیەک هەبێت بۆ ئەهلی سونە!!؟

ابن القیم ئەڵێت:
ئەهلی ئیسلام لەنێو خەڵکیدا غەریبن..
ئیمانداران لەناو ئەهلی ئیسلام غەریبن..
ئەهلی عیلم لەنێو ئیمانداران غەریبن..
وە ئەهلی سوننە ئەوانەی سوننەت لەگەڵ
قسەی نەفس و بیدعە لەیەکتر جیائەکەنەوە غەریبن..
وە ئەوانەی کە دەعوەی بۆ ئەکەن و
صەبر لەسەر ئەزیەتی بەرامبەرەکانیان ئەگرن
لەهەموو ئەوانەی پێشتر غەریبترن
بەڵام ئەوانە بەڕاستی أهلی اللەن بەتەواوی..!
[مدارج السالکین]

ئیمـام الآجري ئەفەرموێـت: نـامۆکـانی ســـەردەمی ئێمە ئەوانەن دەســـتیان بە ســـوننەت ـەوە گـرتووە و ئارامی لەســـەر دەگرن، وە ئاگاداری بیدعە ـن و ئارامی لەســـەر دەگـرن، وە شـــوێن ئاثار ـی ئیمامەکانی سەلەف دەکەون.
[کتاب الغرباء]

ئیمام الآجري ئەفەرمویت: ناموکان لەم کاتەی ئیمەدا ئەوەیە دەستی گرتووە بە سوننەتەکانەوە وە ئارامی گرتووە لەسەری وە خۆی پاراستووە لە بیدعە و ئارامی گرتووە لیی وە شوین ئا ثاری سەلەف کەوتووە لە پیشەوایانی موسلمانان وە سەردەمی خۆی ناسیوە وە خراپەی سەردەمەکەی و خەلکەکەی ناسیوە.
(کتاب الغرباء ٦٣)

وە هەروەها ئەفەرمێ: ناموکان لەم کاتەی ئیمەدا بریتین - لەوانەی کە دەست دەگرن بە سوننەتەکانەوە و ئارامی لەسەر دەگرن، وە ئاگاداری دەکات لە بیدعەو داهینراوەکان و سەبری لێ دەگریت، وە دوای ئاسار وپاشماوەی پیشینی چاکی ئیمامەکانی موسلمانان دەکەویت، وە فە سادو ناپە سەندی زەمەن و کاتی خۆی دەزانیت و وە فەسادو ناپەسەندی خەلکەکەیشی دەزانیت، وە خۆی سەرقالی چاکردنی نەفسی خۆی دەکات بە پاراستنی ئەندامەکانی لاشەی، وە بە وازهینان لەوەی کە پەیوەندی بە ئەو نییە، وە کار لەوە دەکات کە شکانەکانی خۆی چاک بکات، وە داواکردنی بۆ دونیا بەو ڕاددەیە کە بەسیبێ و وازدیدیت لە بەدەست هینانی گەورەییەکەی کە وای لیدەکات سنور ببەزینیت، وە بە ئارامی و نەرمی و دانایی لەگەڵ خەلکی زەمەنی خۆی جولاوەو ئارامی لەسەر ئەوە گرت وە فیڵ نادرووستی لەگەڵ ئەنجام نەدان و ئارامی لەسەر ئەوە گرت، ئا ئەم جۆرە کەسە نامۆیەو غەریبە، وە ئەم جۆرە کەسە خاو و خیزان و خزم برادەری کەمە و ناچن بەلایەوە، بەڵام ئەمە هیچ زەرەری لێ نادات. [کتاب الغرباء]

وە دەفەرمێ: هەرکەس پێی خۆشــە بگاتە پلە وپایەی غەریبەکان، با ئارام بگرێت لەسەر ناڕەحەتکردن وخراپێتی دایک وباوکی وخێزانەکەی وبراکانی ونزیکەکانی. [ كتاب الغرباء]

**الغرباء: ئەوانەن کە لەســەر تەوحید ومەنهەجی ئیســلامی ڕاســتن لە کاتێکدا زۆرینەی خەڵک لە ناو گێژاوی گومڕاییەکان دان.**

ابن سیرین دەفەرمێ: ئەگەر بەندە شوێنکەوتووی ئەثەر بێت، ئەوا لەسەر ڕێگا ڕاستەکەیە. [الشريعة الآجري]

ســـوفیانی کــوڕی عیینە ئەفەرموێت: پابەندبە بــە حــەق ــەوە، وە دڵتەنگ مەبە بە کەمی شوێنکەوتووانی.
[الزهد الكبير للبيهقي ٢٣٨]

لە کۆتاییدا ئاگادار بە کاتێك الله عزوجل هیدایەتی داویت بۆ ڕێگای ڕاست وسوننەت لەناو کۆمەڵێك خەڵك کە ئەهلی شرك وگومڕاین و دوورن لە ڕێگای هیدایەت، پێویستە سپڵە و پێنەزان نەبیت بەرامبەر بەم نیعمەتە گەورەیە کە اللّٰه تۆی ئاشــنا کردووە بەم ڕێگایە پاکە، وە تۆی نەگێڕاوە بە یەکێـك لەم ڕێژە زۆرەی خەڵکی کە دینـداری ناکەن بەو مەنهەجەی رسـول اللّٰه صلّ اللّٰه علیه وسـلم پێی هاتووە، بیر بکەوە لە نـاو ئەم ڕێژە زۆرە لە ئەهلی بـاتـڵ اللّٰه هیـدایەتی کەمینەیەك لە خەڵکی داوە و هەڵبژاردوون تـاکو ڕێگـای ڕاســـت پەیڕەو بکەن و ڕازییە لە مەنهەج وعەقیـدەکەیـان تۆش یەکێکیـت لەم کەمینەیە، بۆیە پێویســـتە لەســـەرت هەمیشـــە ملکەچی فرمانەکانی الله بیت وە شـــوکرانەی نیعمەتەکانی پەروەردگار بیت، بترسـە لەوەی ئەم نیعمەت وبەخشـشە گەورەیەت لێ وەربگیرێتەوە لە لایەن ئەوکەسەی هیدایەت و گومڕای بەدەستە.

پێغەمبەر صـلّ الله علیه وسـلم ئەفەرموێت: (بەڕاسـتی دڵەکانی نەوەی ئادەم لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دان، هەر چۆن بیەوێت هەڵیئەگڕێتەوە.) [صحیح ابن حبان ٩٠٢]

